# ئێرانی کێن؟!

نووسەر: محەمەدعەلی جەماڵزادە

وەرگێڕ: میلاد خزری

ئێرانییەکان قەدوباڵایەکی باش و مامناوەندیان هەیە، هەندێک ئەسمەر و هەندێکیش کاڵن، هەرچەندەی فرەوێژن ئەوەندەش تەوەزەل و تەنبەڵن. قسەخۆش و دەمبەپێکەنینن بەڵام گرینۆکیشن. تا بڵێی زمانلووس و قسەزانن، زمانی لووس و ڕیاکاری بەجێوڕێ، پیاوی دنیا و خواشیان بۆ دێنێتە ڕێ. منداڵان بێتووک و کەچەڵن، پیاوەکانیان سەر دەتاشن و ڕیشەوسمێڵ ڕادەکێشن. بەڵام زۆر سەیرە! دەڵێی ئەو مەملەکەتە ژنی تێدا نییە. کچ و منداڵوپاڵ لە کوچە و کۆڵانان لە گەمە و کایەدان بەڵام هیچ ژنێک نابینرێ. عاقڵم پێی ناشکێ، لێی تێناگەم. بیستبووم شارێک بە نێوی شاری ژنان هەیە و پیاوی لێ نییە بەڵام قەت بە عەمراتم بە شاری پیاوانم نەزانیبوو. لە فەرەنگستان دەیانکوت لە ئێراندا هەر پیاوە و حەرەمسەرایەکی هەیە و ژن جمەیان دێ. ئەدی کوا؟ خودا هەڵناگرێ گێل و نەزانن! ئەخە چۆن شتی وا دەبێ؟ لەم ئێرانە پانوبەرینەدا تاقە ژنێک دیار نییە، دەشڵێن هەر پیاوە و حەرەمسەرایەک! تەح لەو هەموو نەفامی و دەبەنگییەی فەرەنگستان! ڕۆژێکی دەخولامەوە، شەقامم دەپێوان دیتم خەڵک دەورەی کەسێکی قژپەلکە و دەموچاو سافولووسیان داوە، سپیلکە بوو و جلێکی سپیشی لە بەردا بوو و پشتێندێکی هەوریشی لە نێوقەدی هاڵاندبوو. فیتی خۆمم ناسی. کوتم هەبێ و نەبێ ئەوە ژنە و خەڵک لێی خڕ بوونەتەوە. بەلەز خۆم بە ئاپۆرەکەدا کرد کوتم هەر نەبێ با ژنێکی ئێرانیش ببینم بەڵام دەملەپووش مامەوە. ژن نەبوو دەروێش بوو. هەڵبەت ئەوان پێیان دەکوت دەروێش. دیاربوو دەروێش گۆرانیی دەکوتن و سەمای دەکردن و دەفی دەکوتان. وەکی دیاربوو ئێران ئۆپێرا و شتەی نەبوو، بەناچار دەروێش لێرە و لەوێ دەخولانەوە و گۆرانیان

دەکوتن و نەمایەشیان دەدان. لە فەرەنگستانی ئێمە خەڵک بەڵیت دەدەن و دەچنە ژووری لێرە خەڵک برەپارەیەک دەدەن و بێجگە لە شانۆ و گۆرانی، پەڕێکی سەوزوکەسکیشیان وەگیر دەکەوێ.

هاوڕێیەکی ئێرانیم سێ‌چوار منداڵی وردی هەبوون، ڕۆژێکی لێم پرسی کوتم ئەرێ جوامێر، ژنەکەت کوا؟ سوورسوور هەڵگەڕا، چاوی زەق بوون و ڕەنگێکی خراپی هێناوبرد. ترسام! زانیم پرسیارێکی خراپم کردوە و داوای لێبووردنم لێ خواست. ئیدی تێگەیشتم لەو مەملەکەتە نەک هەر ژن قاتی‌وقڕییە، باسکردنیشی تاوانە.

شتێکی دیکەی لە ئێراندا بە لامەوە زۆر سەیرە ئەوەیە کە بەشێکی زۆری خەڵکی، دەتوانین بڵێین نیوەیان، سەرتاپێی خۆیان لە جلکێکی ڕەشی قەیتانیدا دادەپۆشن. یانی بۆ هەناسەدانیش کونێکی تێ‌ناکەن. لێرە و لەوێ خۆ ڕادەوەشێنن و بێرە و بەوێدا دێن و دەچن. ئەو تاقمە مافیان نییە بچنە شوێنە گشتی و قاوەخانەکان و زۆر شوێنی دیکەش. حەمام و شۆرگەشیان جوێیە. لە پرسە و سەرەخۆشی و ڕێوڕەسمەکانی دیکەشدا شوێنی تایبەتیان هەیە. ئەوانە تا بەتەنێن ورتەیان لێوە نایە بەڵام کە لێک کۆ بوونەوە دەیکەنە هەراوهوریا و ورتەورت، هەر بۆخۆشیان لە خۆیان حاڵین. من پێم وایە ئەوانە کەشیشی ئێرانی بن وەک کەشیشەکانی خۆمان بەڵام ئەگەر کەشیشن بۆ ڕێز و حورمەتێکی ئەوتۆیان نییە؟! هەرچەند ئەوان پێیان دەکوتن «×عیفە»، ئەو جۆری ئەمن تێگەیشتم یانی لاواز و بێدەستەڵات.

ئەوجار بچینە زگ پیاوەکان. پیاوەکانیان بە کڵاوەکانیان دەناسرێنەوە و بەسەر سێ بەشدا دابەش دەبن. کڵاوزەرد و کڵاوچەرموو و کڵاوڕەش.

دەستەی یەکەم پێیان دەڵێن مەشەدی و کەربەلایی و زۆرتر نۆکەر و بەردەستی ئاغا و ئەربابانن. بۆچی سوێندیان خواردووە تا هەن لە خزمەت ئەواندا بن و کار و کوێرەوەرییان بۆ ئاغایان بێ و ملکەچ و بەرئەمری کڵاوچەرموو و کڵاوڕەشان ڕاوەستن، نازانم. چ سوڕڕێکە وا شەش‌دانگ بە خۆ و ماڵ و منداڵەوە بەرئەمری ئەوانی دیکەن، تێناگەم. بە ڕووتی و قووتی خۆ و منداڵیان دەبەنە ژێر گڵ و هەرچی داهاتیانە دەیدەنە دوو دەستەکەی دی. ئەوانیش بە کەیف و هەوای گونان لە شندەوڕندەی دەدەن و شەپشەپێنێ بە پوڵوپارەی مفت دەکەن. هێندەیان بۆ دێتەوە خەریکە سەریان بخوا. هەندێکی بۆو سەڵت و دمڕووتە عەرەبانەش دەنێرن تا خۆیانی پێ خڕ کەنەوە هەندێکیش لە ماڵێیان کونە کەونێک بێ، چادر و چارشێوێک بێ دەیگرنەوە و دەیکەنە شوێنی پاڕانەوە و دوعا و فاڵوماڵان. ئەم و ئەو دێنە سەردانیان، هەندێک دەم و لێوی بۆ هەڵدەقرچێنن و دەستوپلانی لێ ڕادەوشێنن، وەکی دەشڵێن شیفاعەتی مردوو و زیندوانە!

هەموو فکروزکر و کردوکۆشی کڵاوچەرموو و کڵاوڕەشان ئەوەیە کە کڵاوزەردێکی زۆرتر لە دەورەی خۆیان کۆ بکەنەوە. بەداییم خەریکی کڕین و فرۆشیانن، نرخیشیان ئەوەندە کەمە وەبەر چاو نایە. هەر وەک ئێمە لە فەرنگستان مێشهەنگوێن بە مێش و هەنگوێن و خەڵفە و سندووقەوە مامەڵە دەکەین، کڵاوزەردیش بە ماڵ و منداڵ و دێ و شار و شارۆچکەوە مامەڵە دەکرێن. دەڵێن ئەمڕۆ فلانکەس و فلانگوند و سەد کەس عایلە کڵاوزەردم بەوەندە قەباڵە کرد .

ئەو چینە کڵاوزەردانە لە هەموو نیعمەت و بەرژەوەندیی برایەتی و یەکسانی و ئازادییەی وا لە فەرەنگستان بۆتە بنێشتەخۆشەکەی ئێرە و ئەوێ و لە چ جێگایانیش دیار نییە، بێبەر و بێبەشن. لە ئازادیدا هەر ئەوەندەیان هەیە کە دەتوانن دارایی و داهاتیان پێشکێشی دوو دەستەکەی دی بکەن و کەسیش نەڵێ بۆچی و بۆ. لە بابەت یەکسانیشەوە، لە هەزاران بکۆڵییەوە یەکێ نابینییەوە شتێکی هەبێ ئەوانی دی نەیانبێ. لە دەستکورتی و هەژاریدا بەرابەرن. تەنانەت ئەگەر مردیشن هیچ کێل و تیتۆڵان لەسەر مەزاریان هەڵناچەقێنن. نەناسراو دەژین و نەناسراویش دەمرن؛ وەکوو یەک. برایەتیشیان گەیاندوەتە قۆناغێک هەموو یەکدی بە «داش» گاس دەکەن.

بچینە زگ کڵاوچەرمووەکان، ئەوانە بە شێخ و ئاخووند ناودێر کراون و لە نێو خەڵکدا ڕێز و حورمەتێکی یەکجار زۆریان هەیە. چمکە بە کڵاوەکانیان دەناسرێنەوە، هەرچی پارچە و کووتاڵی سپییان وە گیر کەوێ لە لە سەروگوێلاکی دەهاڵێنن، دەڵێی قەلاغە قلاپرچن کراوە. ڕۆژێک پیلی ئێرانییەکم گرت ڕامکێشا و بەنهێنی پرسیم کوتم ئەرێ جەریانی ئەو پارچەپێچکردنە چییە؟ کوتی نەتدیوە یەکێک قامکی بریندار دەبێ هەڵیدەبەستێ؟ ئەوانەش سەریان ناساغە، عەیبدارە هەڵیدەپێچن تا با لێی نەدا !

خودا هەڵناگرێ قورس و ماقووڵیشن. ئینجا بۆ ئەوەی کڵاوەکەیان لاسەنگ نەبێ و بە پشتەوەدا بەریان‌نەداتەوە، ڕدێنیان درێژ دەهێڵنەوە. ئەوەندەش لەسەرخۆ و هێمنن تێیان‌هەڵبنگووی سڵاویان لێ نەکەی بە خۆتدا دەشکێیەوە. ئەو کڵاوچەرمووانە لە ساڵدا یەک- دوو مانگێک سواری ماین و گوێدرێژان دەبن و بە کوچە و کۆڵاناندا بە هەلاوهەنگەمە و زیکر و وردان دەخولێنەوە. ئەوەندەی لێ دەڵێن هەتا هەموو هەراسان بن و کڵاوزەردەکان بکێشنە دەرەوە و بێنە خزمەتیان. جلکێکی سەروبن سپی لە بەریان دەکەن و بە چەقۆ و کێرد و بە قەولی خۆیان «قمە» خۆ لە خوێنی خۆیاندا شەلاڵ دەکەن ئەوەندە لە سەروگوێلاکیان دەدەن. بە درێژایی ئەو ماوەی لە ئێران بووم پێم خۆش بوو بزانم بەڕاستی کاروپیشەی ئەو کڵاوچەرمووانە چییە؛ ئێستاشی لەگەڵدا بێ هەر بۆم دەرنەکەوت. بەڵام هەرچێکی بێ دەبێ کارێکی نهێنی و پەنامەکی بێ و لە

خەڵکیش بشارێتەوە. پێم وایە سەنعەتیش بێ. چون هەرچی دەهات ڕۆ دەبووە دەستیان و دەستی ماچ دەکردن. ڕۆژێکی لە ئێرانییەکم پرسی کوتم دەزانم سەنعەتێکیان هەیە بەڵام نازانم چییە. کوتی بەڵێ، بێگومان سەنعەتێکی گەورە و مەزنیشە، لە سایەسەری ئەوانەوە ئێران، ئێرانە. ئەوانە نەبان بناغە و شیرازە دەڕووخان. کوتم باشە ئەی نێوی ئەو سەنعەتە چییە؟ کوتی: «رشوه». ئەمن پێم عەیب بوو بڵێم واتاکەی چییە و یانی چی بۆیە نەمپرسی و ئێستاش هەر نەمزانی مەبەستی چی بوو بەڵام دوایە زانیم گاڵتەی پێ کردووم. چون لە درێژەی باس‌وخواسەکەماندا کوتم بەڵێ خۆ دیومە دەستیان سوورە، لەوانەیە هەر بۆیەش دەستیان سوور بێ. کوتی نا. ئەو سوورییە ئی خوێنی خەڵکییە. دوایە زانیم دەستیان لەبەر خەنە سوور هەڵگەڕاوە. خوێنی چی و شتی چی؟ ئەوە بوو کە زانیم گاڵتەی پێ کردووم .

هەرچۆنێکی بێ کارمان پێی نییە بەڵام پێ دەچێ لەو سەنعەتەدا تەنیا و زۆرتر دوو قامکی دۆشاومژە و هەسپێ‌کوژە دەوری سەرەکییان هەبێ. چون دایمە هەوڵ دەدەن نیشانی خەڵکی بدەن و لێکیان بسوێنن و هەندێک ورکەبەرد و ورکەمورووی وا پێکەوە بە بەنێکەوە کراون، پێ بژمێرن. ئەوەش وەکی من لێی تێگەیشتبێتم بۆ بەهێزکردنەوە ئەو دوو قامکەیە.

جا بچینە سەر چینی سێیەم، کڵاوڕەشەکان. لە ئێراندا بەوانە دەڵێن «خان». هەموو ناوەندە دەوڵەتییەکان لە بەر دەستی ئەو تاقمەدان. کۆڕێکی گەورە و تایبەتیان هەیە، ئیدی هەرکەس پێی تێناوە نانی لە ڕۆنی ناوە. نێوی کۆڕەکەیان «دیوان»ـە. وشەیەکی خۆماڵی و خۆجێی ئێرانە، دەشڵێن لە هەڵسوکەوتی دێوڕا هاتوە. ئەگەر چاکەی لە حەقدا بکەی دەتخوا ئەگەر ڕاستی پێ بڵێی دەبێتە دژمنت ئەگەریش درۆت لەگەڵ کرد ئەوە هاوڕێتە. ئەوانەش بناغەیان لەسەر درۆ داڕشتووە بۆیە نێوی دیوانیان هەڵبژاردوە .

بۆ ئەوەی کەسێک ببێتە ئەندامی دیوان دەبێ ناوی خۆی بگۆڕێ، گرنگیش نییە چ ناوێک بێ. بۆ نموونە هەندێک ناوی خۆیان دەنێن «کلب الدوله» یانی چوارپێی سوور، یا «مقرا× السلا×نه» بە واتای مقسەت و برینگ! ئەم کڵاوڕەشانە هێندەش دەستڕۆیشتوو نین. چونکە ناتوانن کارێک بکەن و شتێک بڵێن کە بەرژەوەندیی خۆیانی تێدا نەبێ. بیستبووم لە فەرەنگستان فەیلەسووفێکی ئینگلیزی فەلسەفەی بەهرەپەرستی داهێناوە بەڵام دەبێ بزانن کە تەنانەت بەر لە حەوت پشتی کابرای گۆرینیش ئەمە لە ئێراندا هەر هەبوە. چ بەڵگەیەکی پتەوتر و بەهێزتر لەوەی کە بتوانین پێی بیسەلمێنین کە سەرچاوەی شارستانێتیی فەرەنگستان، ڕۆژهەڵات بوە؟!

هەوڵوتەقەلای ئەو کڵاوڕەشانە ئەوەیە کە بێدەنگی و ئارامی بەسەر وڵاتدا زاڵ بێو چونکیش دەزانن سەرچاوەی هەموو دژایەتی و نێوانناخۆشی و بەوبەختییەکان پوڵە بۆیە هەموو هێزی خۆیان دەنێنەوە تا گیرفانی خەڵکی پێ هەڵتەکێنن. ئیدی هەر ئەوەندەیە بە تاقە تمەنییەک بزانن، پەنجا زەلامان ڕادەسپێرن تا لە حەوای بیقۆزنەوە و بە ئارمانەکانیان بگەن. لەگەڵ ئەوەشدا پوڵەکە هەر لە ئێراندا ماوەتەوە، لە تڕندەرێ ناردراەتە تسندرێ. بە بڕوام دەبێ کارگێڕ و دەستەڵاتدارەکانی ئێمەش ئەم سیاسەتە ڕەچاو بکەن.

چینێکی دیکەی ئەو کڵاوڕەشانە ڕواڵەتێکی بڕێک جیاوازیان هەیە. ڕدێنی لێ شەشتیخ دەکەن و سمێڵان بادەدەن و کڵاوەڕەشەکەیان قیلەوقاچ لەسەر تەپڵەسەریان دەچەقێنن. بەوانە دەڵێن «فکلی». ئەمانە خوازیاری هەندێک چاکسازی و گۆڕانکاریی ئایینامەی دیوانن. بۆ نموونە دەڵێن لە بەرانبەر کڵاوسپییەکان یاسا جێگیر نییە و ئەو جۆرەی پێویستە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ناکرێ و لە ماڵیات و مووچەدا نابەرابەری هەیە و نابێ لە کڵاوزەردەکان هەڵاوێردرێن. بە بڕوای منیش خراو ناڵێن. لێرەدا پێویستە سپاسێکی بەحەق پێشکێشی فەرەنگستانی خۆمان بکەم بۆو کاریگەرییە ڕەوا و بەجێیەی لەسەر ئەم چینەی هەبووە!